لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی



د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

لە بەشی دوەمەی بەرگی دوەمی
« گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »
دەرهێنراوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغدا ١٩٧٤

# لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی (١)

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

## بەشی یەکەم

لێکسیکۆلۆژی بەشێکە لە زانستی زمان و لە بارەی باری ئێستا و رابوردوی وشەوە دەدوێ . لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی یاسای وتووێژی ئەمڕۆ و دوێنێ و شێوەی پەیدابوون و پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانەکەمان و پەیوەندی لەگەڵ مێژووی گەلی کوردمان بۆ دەردەخا و روون دەکاتەوە .

کاکڵ و کەرەستەی لێکۆڵینەوەی لێکسیکۆلۆژی بەر لە ھەموو شتێك وشەیە . وەك ئاشکرایە ( مۆرفۆلۆژی ) یش ھەر لە وشە دەدوێ ، بەڵام لێرەدا دەیکاتە ھۆ بۆ لێکۆڵینەوە لە دەستوور و

---

(١) وشەی لێکسیکۆلۆژی lexicology کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، پێکھاتووە لە : ( lexikos ـ وشەکانی زمان ، وشەی فەرھەنگی ) و ( logos ـ زانست ) . بەم جۆرە وشەی لێکسیکۆلۆژی بە مانای ـ زانستی وشە ـ دێت .

ڕێزمان . کەچی لە لێکسیکۆلۆژیدا کاری پێویست و گرنگ زانین و ناسینی وشە و وشەکانی زمانە .

بە وێنــە ئەگەر لە باری مۆرفۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژییەوە تەماشـای وشـەی « پاك » بکەین ، دەبینین ئەوەی کە بەلای مۆرفۆلۆژییەوە گرنگە ئەمەیە کە ئەم وشـەیە — (ئاوەڵناوە Adjective ) ، (ئاوەڵناوی سادەیە Adjective Simple ) ، لە ( پلەی بەراورد Comparative Degree )دا دەبێ بە « پاکتر » و لە ( پلەی باڵا Superlative Degree )دا دەبێ بە « پاکترین » .... هتد .
بەڵام بە نیسبەت لێکسیکۆلۆژییەوە ، ئەوەی پەیوەندی بە وشـەی « پاك »ەوە هـەبێت ، ئەوەیە کە ئەم وشـەیە لەگەڵ « پاقژ » و « پاکژ » و « خاوێن »دا هاوواتا ( Synonym ) یە و لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکاری دەهێنن و لەگەڵ وشەی « پاك » — کە بە مانای « تێکرا ، هەمو » دێت هاوبێژ ( Homonym )ە .... هتد .

هەروەها ئەگەر لە وشـەی « عەشق » وردبینەوە ، دەبینین ئەوەی بۆ مۆرفۆلۆژی گرنگ بێ ئـەمەیە کە ئەم وشـەیە ( ناو Noun)ە ، ( ناوی مەعنـا Abstract Noun )یە ....... وە بـۆ لێکسیکۆلۆژیش ئەمە گرنگە کە « عەشق » وشەیەکە لە مێژە کورد لە زمانی عەرەبییەوە وەری گرتووە ، ئەم وشەیە لەگەڵ « ئەڤین ، ئەوین ، دڵداری »دا هاوواتایە . .... وشەی « ئەڤین »یش وشەیەکی کوردی پەتییە و سـەر بە دیالێکتی کرمانجی ژوورووە و چەنـد

ساڵێکە لە دیالێکتی کرمانجی خوارۆدا جێگەی خۆی گرتووە و بووە بە وشەیەکی ئەدەبی و لەگەڵ « ئەوین » و « عەشق » و « دڵداری » دا هاوواتایە ....

تاکو ئەم شوێنە تا رادەیەك ئەرك و گرنگی لێکسیکۆلۆژیمان بۆ رۆن بووەوە و بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە لێکسیکۆلۆژی لە وشە و وشەکانی زمان دەکۆڵێتەوە لە بارەی :

١– مانا و واتایانەوە ؛

٢– شوێنیان لە یاسای گشتی زماندا ؛

٣– پەیدابونیانەوە ؛

٤– بەکار هێنانیانەوە ؛

٥– دەرفەتی جێکردنەوەیانەوە لە ئاخاوتندا ؛

٦– جۆری دەربرین و شێوەی چەسپاندنیان لە بەلاغەدا .

ئەرکی ئەم لێکۆڵینەوانەش دەکەوێتە سەر سێ بەشی هەرە گرنگی لێکسیکۆلۆژی کە بریتین لە :

واتاناسی (علم معانی الالفاظ Semasiology)[٢] و زانستی

(٢) واتاناسی Semasiology بەشێکی سەرەکییە لە زانستی وشە و لە گشتی ئەو مەسەلانە دەکۆڵێتەوە کە پەیوەندییان بە مانای وشەوە هەیە .

وشەداتاشین (علم الاشتقاق Etymology)[3] و (علم العبارات الاصطلاحیة Phraseology)[4].

لەم سێ بەشە گرنگەی لێکسیکۆلۆژیدا دەتوانرێ تێکڕایی ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە وشە و وشەکانی زمانەوە هەیە شی بکرێنەوە . منیش لەم باسەدا هەوڵ دەدەم بەو پێیە لە لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی بدوێم و هەروەها بە خوێنەری بەڕێزی ڕادەگەیەنم کە لە بەشی یەکەمی ئەم وتارەمدا تەنیا لە (واتاناسی) دەکۆڵمەوە و بەشی (ئێتیمۆلۆژی و فرازیۆلۆژی)یش لە دەرفەتێکی تردا پێشکەش دەکەم .

## واتاناسی SEMASIOLOGY

**وشە :**

وشەکانی هەر زمانێك وەنەبێ تەنیا لە کۆمەڵێك وشە پێکهاتبن ، بەڵکو بریتییە لە یاسا و دەستوورێکی ورد و ئاشکرا و تەواو و ڕێكوپێك و دیاری کراو لە پەیوەندی و پەیوەستی ڕاست و ڕەوادا .

(٣) ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە کە لە پەیدابوون و پێشکەوتنی وشە و ئەو دەورانەی پیایدا تێپەڕبوە دەدوێ .

(٤) لە یەکگرتنی هەندێ وشەدا مانای تایبەتی پەیدا دەبێ و بەم جۆرە وشە و دەستە واژانە دەڵێن فرازیۆلۆژی کە بەشێکە لە زانستی وشە .

لێکسیکۆلۆژی زانستێ نییە کە لە بارەی وشـەی جوێ جوێوە بدوێ، بەڵکو زانستێکە دەربارەی سیستێم و دەستووری تێکڕایی وشەکانی زمان.

هەرچەندە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان لە بارەی وشـەوە، لێکۆڵینەوە زۆرە و لە گەلێك سوچەوە لەم مەسەلەیە وردبوونەتەوە و گەلێك زانا بەم کارەوە خەریك بوون و بەرهەمی بەنرخیان پێشکەش کردوە و ئەنجامی سـەرکەوتویان وەدەست هێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا تەعریفی تەواوی وشـە نەکراوە و لەم بارەیەوە رایەکی یەکگرتوی وەها نییە کە گشت لایەك و تایبەتێتیەکی ئەم باسـەی گرتبێتەوە و هەموو زمانناسان لایەنگیری بکەن.

ئەوەی لەم بارەیەوە پەیوەندی بە تەعریفی وشەوە هەبێت کە لە وڵاتی ئێمە نوسـراوە ئەوەیە کە تا رادەیەك کاڵ و کرچن و تەنیا سوچێکی باسەکە دەگرنەوە[٥].

(٥) بە وێنە :

مامۆستا سـەعید صدقی لە لاپەڕە (٦)ی کتێبی « صرف و نحوی کوردی »دا ( بەغدا ١٩٢٨ ) لە تەعریفی وشەدا دەڵی : « تەنیا لفظێکە کە مەعنای ببێ، وەکو ( پیـاو ، درەخت ، ئەسـتێرە ، بەرد .... ) ».

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (٩)ی بەرگی دووەمی کتێبی « قواعدی زمانی کوردی »دا کە ساڵی ١٩٥٨ لە بەغدا بلاوی کردۆتەوە، لە تەعریفی وشەدا نوسیویتی : « ئـەو وشەیەیە کە لە=

---

یێشك تەعریف و دیاری کردنی راست و زانستی‌یانەی وشە ئەوەیە کە تیشك و رۆشنایی ئەو نیشانە سەرەکیانەی لە وشەدا هەن دەخۆیدا بنوێنێ . وشەش پێویستە ئەو خاسیەتە بنەرەتیانەی خوارەوەی تیدابێ :

---

= دەنگێ یا چەند دەنگێ پێك ئەهێنرێ و ئەوترێ و ئەنوسرێ ، وەك ( خ ، آ ، ن ، ز ، آ ، د ) ئەگەر بدرێنە دەم یەکتر ، وشەی ( خانزاد )ی لێ پێك دێ . وە وشەش دوو جۆرە : « . وە لە لاپەڕە ( ٢٢ )ی کتیبێ « رێزمانی کوردی » شدا ( سلیمانی ١٩٦٠ ) لە بارەی وشەوە دەڵێ : « وشە کەرەسەی زمانە و لە دەنگێ وە یا چەند دەنگێ دروست ئەکرێ ، وەك وشەی ( خانزاد ) لە دەنگی ( خ ، آ ، ن ، ز ، آ ، د ) پێکهاتووە ، وشەش بە پێی زۆر و کەمی وازەکانی دوو بابەتە » .

لە لاپەڕە ( ٣١ )ی بەرگی یەکەمی « فەرهەنگی خاڵ »دا ، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە تەعریفی وشەدا نوسیویتی : « وتە ( کلمة ) وشەیەکە کە مەبەستێکی بێ ، وەك ( دار ، کار ، ژن ، من ، بڕین ، دڕین ) » .

لە کتێبی « زمان و ئەدەبی کوردی » کە د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ و د. ئیحسان فوئاد و مامۆستا صادق بەهائەدین بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی دایان ناوە ( چاپی دووەم ، بەغدا ١٩٧٧ ) ، لە لاپەڕە ( ٢٠ )دا لە بارەی وشەوە نوسیویانە : « وشە ئەو بێژەیەیە کە رستەی لێ پێك دەهێنرێت » ، لە لاپەڕە (٢٨)یشدا دەڵێن : « وشە یا واژە لە چەند دەنگێك پێك دێ » .

١— پێکهاتنی فۆنێتیکی هەبێت ؛
٢— مانا و واتادار بێ .
٣— قەوارەی ڕێزمانی هەبێ .
٤— هەمیشە خاوەنی دەنگ و مانا بێت ؛
٥— هەردەم لە ئاخاوتندا وەك دانەیەك (وحدة) لە زمان بەکار بهێنرێ ؛
٦— پتر لە یەك گیرەی نەبێت ؛
٧— بتوانرێ لە ڕستەدا بەکار بهێنرێ ؛
٨— توانای هەبێ ببێت بە ئیدیۆم .

## جۆری وشـــه :

بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردی - وەکو هەمو زمانەکانی سەر ئەم زەمینە - ئەو وشانەن کە مانای دیاردەیەکی (ظاهرە) مەوزوعی واقیعی جۆراوجۆر دەبەخشن و بەم وشانەش دەڵێن وشـەی تەواو Autosemantic words . لە ڕوی مۆرفۆلۆژییەوە ئەم وشـــانە بە زۆری (ناو و ئاوەڵناو و ژمارە و کردار و جێناو ...... ن) .

هەروەها پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین کە هەندێ پۆل وشە، وەك (پیتی بانگهێشتن و وشەی یاریدەدەر ......) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە دیاردەی واقعیەوە نییە و مانایان شێوەی تایبـەتی

خۆی هەیە و هەر لەبەر ئەوەشە کە مۆرفۆلۆژی بە لێکۆڵینەوەی ئەم وشانە گرنگی دەدا و لێکسیکۆلۆژی تا رادەیەك دەیانخاتە پشت گوێ . لە زانستی وشەدا بەم چەشنە وشانە دەڵێن وشەی ناتەواو .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر وشەی تەواو هەن :

١— ئەو وشانەی لە شێوەی دروست بوون و دارشتنیاندا تا رادەیەك مانایان روون و ئاشکرایە (Motivated, having symbolic value) . ئەم وشانەش لە ئەنجامی وێکچوون و نزیکی (رەنگ ، شێوە ، ئەرك ، ئەندازە ، خاسیەت .... ی) دوو شتدا داتاشراون ، وەك :

شەکرشکێن — لە شێوەی دارشتنی ئەم وشەیەدا ئاشکرا دیارە کە ئامرازێکە شەکری پێ دەشکێنرێ .

سەوزە — هەمو جۆرە شینایيەك دەگرێتەوە کە روابێ . لە وشەی (سەوز)ەوە هاتووە کە جۆرە رەنگێکە ـ واتە لە وێچوونی (رەنگ)ەوە پەیدابووە .

٢— ئەو وشانەی کە پێکهاتن و شێوەی دروست بونیان مانایان روون ناکەنەوە ( Devoid of symbolic value ) ـ واتە شێوەی دارشتنیان مانای ئاشکرا و دیار نیشان نادەن ، وەك :

داڵ — هەرچەندە ئاشکرایە کە (داڵ) مەلێکی گەورەی گۆشت خۆرە ، بەڵام شێوەی داڕشتنی مانای ڕوَن ناکاتەوە .

ترێ — ئاشکرایە کە بەری درەختی مێوە ، بەلام ئەم مانایە لە شێوەی داڕشتنی وشەکەدا دیار نییە .

بێشك هەر یەك لەم جۆرە وشانە مانای تەواوی خۆیان هەیە و بێ واتا نین . هەر وشەیەکیش یەك یاخود چەند مانایەکی هەیە ، ئەو وشانەی تەنیا یەك مانایان هەیەن لە لێکسیکۆلۆژیدا پێیان دەڵێن وشەی یەك واتا Monsemous word ، ئەو وشانەش کە مانایان زۆرە فرەواتا Polysemantic .

لە زمانی کوردیشدا ، وەکو هەمو زمانەکانی تر وشە هەن کە تەنها یەك مانایان هەیە و وشەش هەن کە مانایان زۆرە ، بۆ نموونە دەبینین کە هەندێ وشە ، وەك : ( شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ....... هتد) لە یەك مانا زیاتریان نییە ، بەڵام وشەش هەن مانایان زۆرە و ئەو مانایانەش لە یەك نزیکن ، وەك :

بەردانەوە — ١ـ بەردانی ئاوی گیراو ؛
٢ـ فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە .

جۆشسەندن — ١ـ هاتنە کوڵی شتی شل لەسەر ئاگر ؛
٢ـ ریتییە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا ؛
٣ـ گەرم بوونی یەکێك لە کارێکدا .

پووچ — ١ـ شتی بێ ناوکی بۆشی کاوڕ ،
٢ـ ریتییە لە قسە و گفتوگۆی بێهوودە[٦].

فرەواتایی بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردی ئەوە نیشان دەدات کە بەم زمانە دەتوانرێ باش تەعبیر بکرێت ، هەروەها شایانی باسە کە زوربەی ئەو وشانە بە رەسەن کوردین و لەناو جەرگەی کوردەواریدا هەڵقوڵاون .

## جۆری مانا :

لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر مانای وشەی جیا بکرێتەوە :

١— مانای حەقیقی direct ( proper ) meaning . بەو مانایە دەوترێ کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان دەدات .

---

(٦) لە هێنانەوەی هەندێ نموونە و شەرح کردنی وشەدا سوودم لە چەند فەرهەنگێکی کوردی ، بەتایبەتی فەرهەنگی خاڵ وەرگرتوە .

٢— مانای مەجازی Transfered meaning . بەو مانایە دەوترێ کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان نادات ، بەڵکو لە رێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا مانا دەدات .

بە وێنـە وشـەی « ئاگرنانەوە » لە زمانی کوردیـدا بە مانای (ئاگربەردان بە شوێنێکەوە کە بسوتێ) و (هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشوبنانەوە) دێت . مانای یەکەمی ئەم وشـــەیە ـ ئاگربەردان بـە شوێنێـکەوە کە بسـوتێ ـ کە مانایەکی حەقیقی‌یە ئاشـکرا دیارە کـە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان دەدات . بەڵام مانای دووەمی کە ـ هەڵگیرساندنی شـەڕ و ئاشوبنانـەوە ـ یە مانایـەکی مەجازی‌یە و راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان نادات ، چونکە ئاشکرا دیارە کە لەم روداوەیاندا (گـڕگرتن و سـوتاندن)ی تێدا نییە ، بەڵکو ئەم کارە کە (ناخۆشی و وێرانی و خراپی ...) لەدوایە ، لە ئەنجامی (گڕگرتن و سـوتاندن)ەوە نزیکە . بەم جۆرە لە رێـگای نزیکی و وێـکچـوون و پەیوەندی ئـەو دوو روداوەوە ، وشـــەی « ئاگرنانەوە » بەو دوو مانایە ، واتـــە ـ حەقیقـی و مەجازی ـ هاتووە .

هەرچی مانای مەجازییە لە زمانی کوردیدا پەیـــدا دەبـێ لە ئەنجامی نزیکی و وێکچوونی :

١ــ شــێوە :

بە وێنە وشەی « بارخستن » بە مانای (کردنەوەی بار و خستنی لە شــوێنێك) دێت و ئەمەش مانا حەقیقەکەیەتی . هەروەها بــە (کەوتنی مریشك و کەڵەشێریش لەسەر تەنیشت) هــەر دەڵێن « بارخستن » و ئەمەش مانایەکی مەجازییە . ئاشکرا دیارە کە نێزیکی و وێکچوون لە شێوەی ئەو دوو رووداوەدا هەیە و ئەمەش بــووە بــە هۆی ئەوەی کە ئەو مانا مەجازییە لە رێــگای ئــەو مانا حەقیقیەوە ئەو مانایەی ناومان برد ببەخشێ .

٢ــ ئەرك و خاسیەت :

دەبینین کە وشەی « نەرم » بە هەموو شتێك دەوترێ کە رەق نەبێت ، بەڵام لە ســەرێکی کەوە (مرۆڤی نەرم)یش هەیــە . بێگومان لێرەدا ئەو « نەرم »ە مانای ئــەوە نادات کە مرۆڤ بــە لەش نەرم بێت ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤێکی لەسەرخۆ و ناسك و بەئەدەبە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاسیەت و ئەرکی ئەم دوو مانایە نزیکن و وێکچوون لە نیوانیاندا هەیە .

٣ــ لە مانایەکی فراوانەوە کەرتێــــك ، وە لە کەرتێــکەوە مانایەکی فراوان وەربگیرێ :

أ ــ وەرگرتنی کەرتێك لە مانایەکی فراوانەوە .

بۆ نمونە دەبینین لە زمانی کوردیدا وشەی « بزڕکان » مانایەکی گشتی هەیە ، ئەو مانایەش (تێکچون و شـــپرزەبونی گیانداره له ترسانا) . لەم مانا گشتیەوە بەشێك وەرگیراوە ، ئەویش ئەوەیە کە بە (تێکچونی شیر و ماست و هەندێ شتی تر کە گرۆ گرۆ دەبێ) دەڵێن « بزڕکان » . یاخود وشەی « پشتیوان » بە شێوەیەکی گشتی مانای (یاریدەدەر)ە ، وە لەو مانا گشتیەوە ئـەوە پەیدا بووە کە وشەی « پشتیوان » بەو (دارە بوترێ کە لە باری پانی بە پشتی تای دەرگا و دەڕابەدا دادەکوترێ) .

ب- فراوان بونی مانایەکی تەسك .

بە وێنە دەبینین لە زمانی کوردیدا وشـــەی « باسقەندە » بە (داردەستێك دەوترێ کە لە داری بەڵاڵوك دروست کرابێ) . بێشك ئەمە ناوە بۆ یەك شت ، بەڵام لە هەمان کاتدا ئـــەم مانایە فراوان بووە و بە (هەمو دارێکی باریکی لوسـی کون کراو کە کرابێ بە دەسکی قەندە) هەر دەوترێ « باسقەندە » .

پەیوەندی نیوان وشـە :

لە بەکار هێنانی وشەدا بە مانای جیاواز لە رێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ وشەی تردا دەتوانرێ دوو جۆر وشە جیا بکرێتەوە :

١— وشەی بەرەڵلا .

ئەم جۆرە وشانە دەتوانن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشـەدا پەیوەندییان هەبێ ، بە وێنـە وشـەی « مێز » لە ڕوَی ئەندازەوە دەتوانرێ بوترێ ( بچوك ، گەورە .... ) ، لە ڕوَی شێوەوە ( خڕ ، درێژ ، کورت ، پان ، چوارگۆشـە .... ) ، لە ڕوَی ڕەنگەوە ( سپی ، سوَر ... ) ، لە ڕوَی پێویستییەوە ( نان خواردن ، نوسین .... ) ، لە ڕوَی ئەوەی لە چی مادەیك دروست کراوە ( ئاسن ، دار .... ) ، لە ڕوَی بەکار هێنان و نەوعیـەتەوە ( باش ، جوان .... ) .... هتد .

٢— وشەی گیراو .

ئەمیش ئـەو جۆرە وشانەن کە توانای ئەوەیان نییە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەدا یەك بگرن و لەبەر ئەوە شێوەی بەکار هێنانیان لە قاڵبێکی تەسکدا ماوەتەوە . بە وێنە وشەی « کەڕ ، کۆتەرە .... » لە زمانی کوردیدا ئـەو توانایە و سەربەخۆییەیان نییە کە لەگەڵ ژمارەیەك پۆلی جیاوازی وشەدا ڕێك بکەون و بەکار بهێنرێن .

وشەی هاوبێژ ( مشترك لفظي Homonym ) :

چۆن لە گشت زمانێکدا ، هـەروەها لە زمانی کوردیدا وشە هەن کە بە خوێندنەوە و نوسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە ،

وەك :

ئازار — ئێشی ئەندام .

ئازار — مانگی مارت .

باو — دەستور : فیسار شت بووە بە باو .

باو — باوك .

باو — زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا .

بێگومان ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن لەو وشانە نین کە ماناکانیان زۆرە ـ واتە وشـــەی فرەواتا Polysemantic نین ، بەڵـکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوە و نوسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتا و پەیدابونیاندا جیاوازن ، وەك : ( « ئازار » ـ ئێشی ئەندام ) کە وشەیەکی کوردییـــە زۆر دوورە لە ( « ئازار » ـ مانگی مارت ) کە وشەیەکی کوردی نییـــە و لە پەیدابوون و دروست بوندا سەرچاوەیەکی تری هەیە . یاخود « باو » دەبینین سێ وشەن کە ماناکان جیاوازە و لە یەك دوورن . هەرچەندە هەر سێکیان لە رەسەندا کوردین ، بەڵام پەیدا بون و دروست بونیان لە رێگای جیاوازەوە هاتووە . جا ئەم جۆرە وشـــانە کە لە لێکسیکۆلۆژیدا وشەی هاوبێژ ( Homonym ) یان پێ دەڵێن ، پێویستە لەگەڵ وشەی فرەواتا (Polysemantic)دا جیابکرێنەوە و تێـکەڵ نەکرێن[٧] .

---

(٧) بەداخەوە ، لەم ڕووەوە ـ واتە دەربارەی وشەی هاوبێژ و هاوواتا ==

## جۆری وشەی هاوبێژ :

لە زمانی کوردیدا سێ جۆر وشەی هاوبێژ بەرچاو دەکەون :

١— ئەو وشە هاوبێژانەی چۆن بە خوێندنەوە ، هەروەهاش بە نووسین وەك یەکن . بۆ نموونە :

═ لە زمانی کوردیدا ــ نە بە زمانی کوردی و نە بە زمانی بێگانە هیچ شتێکی وەها نەنووسراوە و ئەمەش ناتەواوییەکی زۆر و کەلەبەرێکی گەورەیە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانەکەماندا ، بەڵام ئەوەی شایانی باسە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە هەندێ لە زانایانی کورد ، وەك مامۆستایان ( تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ ) لە فەرهەنگەکانیاندا لە رێگای کۆشش و زانینی خۆیانەوە بە شێوەیەکی تەجروبی هەندێ کێشەی ئەم کارە ئاڵۆزەیان خاوکردۆتەوە . هەروەها لە لاپەڕە ( ٥٦٩ ــ ٦٢٣ )ی ، ژمارە دووی ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد »دا ( بەغدا ١٩٧٣ ) ، مامۆستا جەمال بابان لە ژێر ناوی « هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن »دا وتارێکی بڵاوکردۆتەوە ، بەڵام کەم و کورتی و هەڵەی هەرە گەورەی ئەم باسە لەوەدایە کە نووسەر وشەی هاوبێژ و فرەواتای جیا نەکردۆتەوە ، بە وێنە :

تاوڵە ــ تەویلەی وڵاخ .
تاوڵە ــ جۆرە یارییەکە کە بە بۆلی تەختە و زار دەکرێت .
تێرە ــ هۆز ، ئێل ،
تێرە ــ تیرەی بن کلاش .

ئەمانە و گەلێکی تر ــ کە زوربەی ئەو نموونانە دەگرنەوە کە═

ئاش — جۆی هاڕین و پاکردنی دانەوێڵە .

ئاش — چێشت .

٢— ئەو وشە هاوبێژانەی بە نوسین وەك یەکن ، بەڵام لە خوێندنەوەدا جیاوازییان هەیە ، وەك :

هەمانە[٨] — ( هـ ) ـ ڕەگی کرداری ( هەبن )ە[٩]

(مان) ـ جێناوی لکاوی کۆیە

( ە ) ـ نیشانەی وجودە لە حاڵدا .

هەمانە[١٠] — کیسەیەك لە پێستی مەڕ و بزن دروست کرابێ .

٣— ئەو وشە هاوبێژانەی لە هەندێ حالآنی ڕێزماندا لەیەك نێزیك دەبنەوە ، وەك :

= مامۆستا جەمال بابان لە وتارەکەیدا هێناویتیەوە ـ لەو وشانە نین کە واتایەك زیاتر دەبەخشن ، واتە وشەی فرەواتا نین ، بەڵکو ئەو وشانەن کە لە ڕێگای چەند هۆیەکی تایبەتیەوە بە خوێندنەوە و نوسین وێك دەچن ، واتە ئەمانە وشەی هاوبێژن ، نەك فرەواتا .

(٨) لەم وشەیەدا گڕە وا بەسەر پیتی دووەمەوە .

(٩) ئەمە کردارێکە کە چاوگەکەی لە بیر چۆتەوە .

(١٠) لێرەدا گڕە وا بەسەر پیتی شەشەمەوە ( دواینەوە ) .

تاڵە — گیانداری رەشی درێژ .

تاڵە — (تاڵ) ـ ئاوەڵناوە .

( ە ) ـ نیشانەی وجودی حاڵە .

بۆ — کوندەبەبۆ .

بۆ — کردارێکی رابوردووە کە لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراوە .

رێبازی پەیدابوونی وشەی هاوبێژ :

١— بوونی چەند دیالێکتێك و بەشە دیالێکتێك لە زمانی کوردیدا هۆیەکی گرنگە لە پەیدابوونی وشـــەی هاوبێژدا . بە وێنە وشەی « بەش » لە دیالێکتی کرمانجی خوارووداا مانای ( هێندێ لە شتێك کە بڕدرابێ بۆ یەکێك ) دەبەخشێ ، وە هـەر ئەم وشـەیە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا بە ( گیانداری ناوچەوان سپی ) دەڵێن .

٢— لە ئەنجامی تێپەڕبوونی کات و رۆژگاردا واتاکانی هەندێ وشەی فرەواتا لەیەك دوور کەوتوونەتەوە و وشەی هاوبێژیان دروست کردوە ، وەك :

زێ — رووباری زۆر گەورە .

زێ — زێی مێینە .

٣ـ چۆن لە مێژوی پەیدابوونی وشەی گشت زمانێکدا، هەروەها لە مێژوی پەیدابوونی وشەی کوردیدا وا ڕێکەوتووە کە دوو وشە، یاخود پتر دابڕژاون بەسەر شتی جیاوازدا و بە ڕێکەوت شێوەی دەربڕینیان وەك یەك بووە. بە وێنە:

باهۆ — شان و قۆڵ.

باهۆ — ئاسۆ.

٤ـ هەندێ وشە کە لە زمانی بێگانەوە کەوتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە، وا ڕێکەوتووە لەگەڵ وشەیەکی کوردیی ڕەسەندا لە نووسین و خوێندنەوەدا وەك یەك بن و لە هەمان کاتیشدا هەر یەکە مانای تایبەتی و جیاوازی خۆی هەبێت، وەك:

بیر — بیر و هۆش.

بیر — (بئر ـ عەرەبی).

بیر ـ (ریەك ـ تورکمانی)

جگە لەو چەند ڕێگە سەرەکیانە، هەروەها هەندێك جار لە حاڵەتی گۆڕینی وشەدا و لکاندنی ئامراز و هەروەها کورت کردنەوە و سوانەوە، وشەی هاوبێژ پەیدا دەبێ.

بەم جۆرە دەبینین کە دەوڵەمەندیی و فراوانیی زمانی کوردیی تەنها لە زۆری وشە و مانای جۆرێ جۆرێدا دەرناکەوێ، بەڵکو لە دەوری چالاك و سامانی بەرین و بەنرخی وشەی هاوبێژیشدا دەردەکەوێ.

## وشەی هاوواتا ( مرادف Synonym ) :

بەو وشانە دەڵێن کە یەك مانا دەبەخشن ، یاخود ماناکان لێك نزیکە ، بەڵام لە خوێندنەوە و نوسینیاندا جیاوازن ، وەك :

لێڕ - دارستان - جەنگەڵ .

ئاوارە - پەڕیوە - دەربەدەر .

جەندەك - کەلاك - تەرم - کەلەش .

توش - دژوار - سەخت - ناخۆش .

خەم - کەسەر - خەفەت .

خاپور - وێران .

.............................. هتد .

سەرچاوەی وشەی هاوواتا :

لە پەیدابون و کۆبونەوەی وشەی هاوواتای کوردیدا چەند ڕێگایەکی جیاواز دەوریان بینیوە :

١- چۆن بونی چەند دیالێکتێك و بەشە دیالێکتیك لە زمانی کوردیدا بووە بە هوی پەیدابونی وشەی هاوبێژ ، هەروەها بوشە بە هۆی پەیدابونی گەلێك وشەی هاوواتا :

أ - بەشێك لەو وشەی هەوواتایانە لە خوێندنەوە و نوسیندا لەیەك دورن ، وەك :

| | |
|---|---|
| ئەوَك | — فوَزَك . |
| گەلەك | — گەلێك ـ فره ـ پڕ ـ زۆر . |
| بەدەو | — جوان ـ قەشەنگ ـ چەلەنگ . |
| باهۆر | — باهۆر ـ رەشەبا . |

ب ) هەندێکیشیان ئەو وشە هاووتایانەن کە لە خوێندنەوە و نوسیندا تا رادەیەك وێکدەچن ، بەلاّم لە شـــێوەی فۆنێتیکدا تۆزێك جیاوازی هەیە . ئەو جۆرە وشانەش لە ئەنجامی لێك نزیك بونەوەی هەندێ دەنگ ، یاخود لە ئەنجامی خاسیەتی تایبەتی بەشە دیالێکتەکان و دیالێکتەکانی کوردیدا پەیدا بوون ، وەك :

| | |
|---|---|
| م / و | دامێن ـ داوێن . |
| هـ / و | هشك ـ وشك . |
| ف / و | چاف ـ چاو . |
| ی / وَ | پاری ـ پاروَ . |
| هـ / ی | تەنیا ـ تەنها . |
| آ / ێ | ما ـ مێ . |
| ئـ / هـ | ئەسپ ـ هەسپ |

........................ وە گەلێکی تر[11] .

(١١) ئەم جۆرە وشە هاووتایانە کە لە ئەنجامی نزیکی دەنگێ ، یاخود خاسیەتی تایبەتی بەشە دیالێکتەکان و دیالێکتەکانی زمانەکەمانەوە هاتون ، پتر پەیوەندییان=

٢ـ لە ئەنجامی بەکار هێنانی شێوازی جودا لە چۆنیّتی داڕشتن و دروسـت کردنی وشـەدا گەلێك وشەی هاوواتا لە زمانی کوردیدا پەیدابوون ، وەك :

بەرەوژێر — بەرەوخوار

بەرەوخوارکە — بەرەوخوارە

بـەرەولێژە — سەرەولێژە

٣ـ هەرچەندە لە زمانی کوردیدا بۆ هەندێ مانا وشەی رەسەنی کوردی هەبوون ، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا وا رێکەوتووە کە بۆ هەمان مانا لە زمانی بێگانەوە وشە بکەونە زمانەکەمانەوە و لەگەڵ وشـــە کوردییەکاندا ببن بە هاوواتا ، وەك :

زەوی — ئەرز — عەرد ، — هەرد .

مەردوم — مرۆ — مرۆڤ — ئادەمیزاد — ئینسان .

هـەژار — بەلەنگاز — فەقیر .

•

وشەی دژواتا Antonym :

لە ســـەرەوە رۆنمان کردەوە کە لە نیوان ژمارەیەکی زۆر لە

= بە باسی فۆنێتیکەوە هەیە ، جا هەر لە بەر ئەوەشە کە لەم رووەوە شتێکی کەمم نوسیوە . دەربارەی ئەم جۆرە وشانە باسێکی سەربەخۆم هەیە ، هیوادارم بەم زوانە بە وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

وشەکانی زمانی کوردیدا پەیوەندیی هاوواتایی هەیە هەروەها پەنجەش بۆ ئەوە رادەکێشین کە پەیوەندیی دژواتایش لە زمانەکەماندا دەوری خۆی دەبینێ .

وشەی دژواتا بەو وشانە دەوترێ کە لە ماناداا بەرامبەر یەکتر دژ وەستاون ، وەك :

گەورە — بچوك .

زۆر — کەم .

بەرز — نزم .

چاك — خراپ .

دوور — نزیك .

رووناك — تاریك .

لەو نموونانەی سەرەوەدا ئاشکرا دیارە کە هەر وشەیەك رەگی جیاوازی خۆی هەیە ، هەروەها وشەی دژواتا دەتوانن خاوەنی یەك رەگ بن ، وەك :

خۆش — ناخۆش .

راست — ناڕاست .

بەنرخ — بێ نرخ .

پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین کە وەنەبێ هەموو وشەیەکی

زمانی کوردی بەرامبەری وشەی دژواتا هەبێت . بۆ نمونە بەرامبەر
هەندێ ناو ، وەك : خانو ، دەرگا ، کتێب ، وشتر .....؛
زوربەی جێ‌ناو ؛ تێکڕایی ژمارە وشەی دژواتا نییە .

- ماوێتی -

- ملخص المقال -

# علم المفردات القاموسية للغة الكردية

د. عبد الرحمن معروف

## القسم الاول

ان علم المفردات القاموسية فرع من علم اللغة، ويعنى بدراسة المفردة اللغوية دراسة تاريخية . وفيما يخص اللغة الكردية فانه يعنى باستجلاء قوانينها ماضياً وحاضراً، وطرائق نشأتها وتطورها وازدهارها، وتواشجها مع تاريخ امتنا الكردية .

أما موضوعه فهو الكلمة من حيث اعتمادها سبيلا الى البحث في قواعد اللغـــة خلافـاً للمورفولوجيا الذي يعنى بها هو الاخر . وايضاحاً للمقارنة بين العلمين فنورد على سـبيل المثال لفظـة « پاك » النظيف فان ما يعني المورفولوجيا منها انما هو تبيان كونها « صفة » « صفة بسيطة » ويصاغ منها في المفاضلة بين أمرين « پاكتر » أنظف وفي المفاضـــلة بين أمر وأمور أخرى « پاكترين » الانظف ... الخ في حين يوضحها علم المفردات القاموسية من حيث كونها مرادفة للكلمات « پاقژ » و « پاكژ » و « خاوێن » وكونها مشـتركاً لفظياً يدل في

كثير من مناطق كردستان على ما تدل عليه لفظتا « تێكڕا ، هەموو » من العموم والشمول ... الخ .

وكذا الأمر في لفظة « عەشق » ففيما ينصب اهتمام المورفولوجيا على تبيان كونها « اسماً » ، « اسم معنى » يهتم علم المفردات القاموسية بكونها عربية ترادف « ئەڤین ، ئەوین ، دڵداری » ... وأن لفظة « ئـەڤین » انما هي لفظة كردية اصيلة ودارجة في اللهجة الكردية الشمالية ، واستقر استعمالها في اللهجة الكردية الجنوبية في الاعوام الأخيرة .

ان علم المفردات القاموسية يبحث في الكلمة اذن من حيث :

١– معناها .

٢– محلها في قواعد اللغة العامة .

٣– نشأتها و ظهورها .

٤– استعمالها .

٥– فرصة استعمالها في الكلام .

٦– نوع التعبير بها وتشبيهها في بلاغة اللغة .

وتضطلع بالبحث فيما تقدم ذكره الاقسام الثلاثة الآتية من هذا العلم :

علم معاني الالفاظ ( Semasiology )

علم الاشتقاق ( Etymology )

علم العبارات الاصطلاحية ( Phraselogy )

على أني في هذه الاقسام الثلاثة المهمة سأكتفي بتناول ما يتصل

عموماً بالمفردات اللغوية من مسائل تاركا الحديث عن « الايتيمولوجيا وغرازيولوجيا » لفرصة أخرى .

## علم المعاني ( SEMASIOLOGY )

**تكمة :**

ان المفردات التي تتألف منها أية لغة لا تعني مجموعة من كلمات لا رابط بينها ، انما يسود وجودها اللغوي نظام وقانون في غاية الدقة والاحكام والوضوح والكمال والتناسق والتحديد في العلاقات الحقيقية والواقعية .

ان علم المفردات القاموسية لا يبحث عن الكلمات على انفراد ، ضمن نطاق ترابطاتها ، بل يبحث عن قواعدها العامة القائمة على اساس من العلاقات المنطقية واللغوية .

وعلى الرغم مما انجزته البلدان المتقدمة في اجراء الابحاث المستفيضة واستصفاء النتائج الموفقة في هذا الباب ، ما زال تعريف الكلمة تعريفاً جامعاً مانعاً لم يتحقق بعد ولما نظفر بصيغة حاسمة تستأثر برضا وقناعة علماء اللغة اجمعين .

ومهما يكن المستوى الذي بلغته المحاولات المبذولة في بلادنا لصياغة تعريف الكلمة فلا يعدو ذلك عن نطاق محاولات فجة نسبياً وجانبية فقط .

ما من شك ان تعريف الكلمة تعريفاً شاملا يقتضي ان يكون

من الشمول والاطراد والحصر بحيث يعكس كل ما لافراد المعرّف من خصائص رئيسة ، كما ينبغي ان تتوافر في الكلمة هى الأخرى الخواص الاساسية الاتية :

١— اشتمالها على تركيب صوتي متميز .

٢— كونها ذات دلالة لغوية على معنى معين .

٣— خضوعها لقواعد اللغة .

٤— كونها ذات صوت ومعنى .

٥— استخدامها كوحدة قائمة بذاتها في الكلام .

٦— ان لا تكون نبرتها اكثر من واحدة .

٧— ان تصلح لاستخدامها في الجملة .

٨— ان يصلح استخدامها مصطلحاً .

أنواع الكلمة :

يؤلف معظم مفردات اللغة الكردية شأن سائر اللغات ، تلك التي تدل على مختلف الظواهر الموضوعية الواقعية وتسمى الكلمات التامة ( Autosemantic words ) وهي من وجهة المورفولوجيا انما تشمل في الغالب ( الاسم ، الصفة ، العدد ، الفعل ، الظرف ... ) كما انِ ثمة نوعاً آخر من الكلمات لا صلة له مباشرة بالظواهر الواقعية ولا يدل على معنى بنفسه . وذلك كحروف النداء والاستعانة وغيرها مما يُعنى به المورفولوجيا عناية خاصة في حين يهمله علم المفردات القاموسية .

وتسمى هذه الكلمات بالكلمات الناقصة .

وفي اللغة الكردية نوعان من الكلمات التامة :

١ــ الكلمات التي تدل بطبيعة تكوينها وصياغتها على معانيها دلالة واضحة . وهي انما تنحت على اساس التشابه والتقارب بين شيئين في « اللون ، والصورة ، والوظيفة ، والمقدار ، والخاصية ... » مثل : شەکر شکێن ، سەوزە . آلة كسر السكر ، الوان البشرة .

٢ــ الكلمات التي لا تدل بطبيعة تكوينها على معانيها دلالة واضحة. نحو : داڵ ، طائر جارح ، ترێ ، عنب ثم ان لكل كلمة ممامر معنى تاماً ، وقد يكون واحداً او اكثر ، فماله معنى واحد يسمى في اصطلاح هذا العلم الكلمة ذات المعنى الواحد. نحو : « شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ... الخ » الليل ، الطحان ، الجار ، الركبة . وماله اكثر من معنى يسمى الكلمة ذات المعاني الكثيرة . نحو : ( بەردانەوە ، جۆش سەندن ، پەرج » ، حيث تدل الكلمة الاولى منها على :

١ــ فتح الماء المسدود .

٢ــ القاء شيء من علٍ .

وهلم جراً ...

على ان كون معظم مفردات اللغة الكردية من ذوات المعانى

الكثيرة ، انما هو دليل قدرة هذه اللغة على اجادة التعبير بها .

## انواع المعنى :

في اللغة الكردية كما في غيرها نوعان من المعنى :

١ــ المعنى الحقيقي ، وهو الذي يعني مباشرة ، ظاهرة موضوعية واقعية ، او كما يقول البلاغيون هو استعمال اللفظ في المعنى الذي وضع له اصلا . وذلك نحو المعنى المقصود من كلمة « ئاگرنانەوە » أي اشعال النار بمعنى احداث الحريق .

٢ــ المعنى المجازي ، وهو الذي لا يعني مباشرة ظاهرة موضوعية واقعية ، او كما يقول أهل البلاغة هو استعمال اللفظ في غير ما وضع له لعلاقة مع قرينة لفظية او معنوية تمنع من ارادة المعنى الحقيقي . وذلك مثل المعنى المجازي المقصود من كلمة ( ئاگرنانەوە ) اي إشعال النار ، اذا اريد بها التحريض على القتال . وليس بخاف أن بين المعنى الحقيقي والمجازي علاقة قد تكون المشابهة ( مجاز المشابهة ـ الاستعارة ) ، كما في المثال الآنف الذكر ، وقد تكون أمراً آخر كما في المجاز المرسل والمجاز العقلي .
أما المعنى المجازي فينشأ في الكردية من التقارب والتشابه بين أمرين في ما يأتي :

١ ــ الهيئة . مثل « بارخستن » اي الاناخة ووضع الثقال ، وهو المعنى الحقيقي . والهيئة الحاصلة من استرخاء الدجاج أو الديك على احدى جهتيه ، وهو المعنى المجازي .

٢- الوظيفة والخاصية، مثل : « نەرم » بمعنى الشيء المرن مطلقاً، وهو المعنى الحقيقي ، والرجل المرن ، وهو المعنى المجاري . وبين المعنيين كما يلاحظ علاقة مشابهة .

٣- ان يؤخذ من معنى واسع جزء ومن جزء معنى واسع :

أ - أخذ جزء من معنى واسع، مثل : « بزڕكان » بمعنى مطلق الفساد للحيوان، وهو المعنى الواسع ، وبمعنى فساد الخاثر خصوصاً، وهو المعنى الجزئي .

ب- التوسع في معنى محدود ، نحو : « باسقەندە » بمعنى العصا من شجر خاص وهو المعنى المحدود ، وكل خشب اسطواني مثقوب يتخذ قناة للغليون ، وهو المعنى الموسع .

## العلاقة بين الكلمات :

يمكن التفريق بين نوعين من الكلمات حين تستخدم الكلمة عن طريق العلاقة مع كلمة اخرى للدلالة على معنى مغاير .

١- الكلمة المطلقة :

ومن شأن هذا النوع ان تتعلق بعدد كبير من الكلمات الاخرى ، نحو : كلمة « مێز » اى المصطبة التي يمكن ان تكون متعلقة تعلقاً وصفياً من حيث القياس بالكلمات « بچووك ، گەورە ... »

الصغيرة ، الكبيرة ، ومن حيث الهيئة بالكلمات « دڕێژ ، كورت ، پان ، چوارگۆشه ... » الطويلة ، القصيرة ، العريضة ، المربعة ، ومن حيث اللون بالكلمات « سپی ، سوور ... » البيضاء ، الحمراء ... الخ .

٢— الكلمة المقيدة :

وهي التي لا يتأتى لها التعلق بغيرها فبقيت محصورة في دائرة محدودة من الاستعمال ، نحو : « كەڕ ، كۆتەرە ... » اى الأصم والجذية .

المشترك اللفظي :

وهو المتحد لفظاً وكتابة والمختلف معنى ، نحو : ئازار ، بمعنى الالم و بمعنى شهرمارت ، وباو ، بمعنى المعتاد ، وبمعنى الاب .. الخ والذي ينبغي التنبيه عليه أن المشترك اللفظي لا يعني الكلمات ذات المعاني الكثيرة ، اذ لا علاقة بين المعاني المشتركه للكلمات المتفقة في اللفظ .

أنواع المشترك اللفظي :

في اللغة الكردية ثلاثة انواع من الالفاظ المشتركة لفظاً :

١— الالفاظ المتفقة لفظاً وكتابة ، نحو :

ئاش : الطاحونة

ئاش : الطعام

٢— الالفاظ المتفقة كتابة والمختلفة لفظاً ، نحو :

هەمانە : يوجد لدينا

هەمانە : الصفن ، القربة

وتلعب النبرة في مثل هذه الكلمات دور التفريق بين المعاني .

٣— الالفاظ المتقاربة فى بعض الحالات النحوية ، نحو :

تاڵە : الحيوان الداكن اللون .

تاڵە : صفة المرارة .

طريقة تكون المشترك اللفظي :

١— قد ينشأ المشترك اللفظي ، كما هو الحال في اللغة الكردية ، من تعدد اللهجات ، ففيما تعني لفظة « بەش » في اللهجة الكرمانجية الجنوبية الحصة ، انما تعني في الكرمانجية الشمالية الحيوان الاشقر الذي في جبهته البياض ،

٢— وقد ينشأ احياناً من تقادم الزمن اذ تتباعد معاني الالفاظ الكثيرة المعاني بعضها عن البعض ، نحو :

زێ : الزاب .

زێ : الولادة .

٣— وقد يحدث ان تطلق كلمتان او اكثر على شيئين مختلفين مع

اتفاق صورة الكلمتين لفظاً بالمصادفة ، نحو :

بیر : الفكر .

بير : (البئر) .

المـــرادف :

وهو الذي يدل على ما تدل عليه الفاظ آخرى قلت ام كثرت دلالة مطابقة ام مقاربة مختلفة في اللفظ والكتابة ، نحو :

لێـــڕ — دارستان — جەنـگەڵ .

ئاوارە — پـەڕیوە — دەربەدەر .

وهكذا ...

مصدر الالفاظ المرادفة :

١— تعدد اللهجات في اللغة الكردية .

أ — تباعد بعض الالفاظ المرادفة عن بعضها لفظاً وكتابة ، نحو :

ئەوَك : قورِّك .

كەڵەك : كەڵێك ـ فرە ـ پڕ ـ زۆر .

ب- الالفاظ المرادفـة المتقاربة نســبياً لفظاً وكتابة والمختلفة نوعاً ما صوتاً ، نحو :

م/و دامێن - داوێن

ه/و هشك - وشك

وهكذا ...

٢- نتيجة لاســتعمال أسلوب مختلف عن كيفية صياغة الالفاظ نشأ في الكردية كثير من المرادفات ، نحو :

بەرەژێر - بەرەوخوار

بەرەوخوارکە - بەرەوخوارە

بەرەولێژە - سەرەولێژە

٣- دخول بعض المفردات الاجنبية في اللغة الكردية رغم ما فيها من كلمات اصــيلة تدل على نفس المعاني التي تدل عليها تلك المفردات الاجنبية مما ادى الى ترادفها معها ، نحو :

زەوی - ئەرز - عەرد ، هەرد

مەردوم - مرۆ - مرۆڤ - ئادەمیزاد - ئینسان

وهكذا ...

**الاضداد :**

وهي الالفاظ التي لا تجتمع في الدلالة على مســمى او معنى

واحد وهى متقابلة متضادة ، نحو :

گەورە ـ بچوك

زۆر ـ کەم

بەرز ـ نزم

وغيرها كثير ...

يتبــع